زنجیرەی گەنجینەی گەوهەر
(٤)

# ٦٥ پرسیار

دەربارەی

# رەمەزانی پیرۆز

ئامادەکردنی

عبدالرحمن نجم الدین طه



١٤١٨ك - ١٩٩٨ز

بسم الله الرحمن الرحيم

# پرسیارەکمان

١ـ وشەی (رمضان) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای چیە ؟

٢ـ کام فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ رەمەزان بە گەورەی مانگەکان ناو دەبات ؟

٣ـ ئەو دەروازەی بەهەشت کە تایبەتە بە رۆژووگران ، ناوی چی‌یە ؟

٤ـ لە ئیسلامدا چەند جۆر رۆژوو هەیە ؟

٥ـ کەی فەتحی شاری ( مەککە ) ی پیرۆز کرا ؟

٦ـ کێ بتی (عوززا ) ی شکاندو ، کەی ؟

٧ـ دوو ئایەت بڵێ باسی شەوی (قەدر) بکەن ؟

٨ـ رۆژووی واجب چەند جۆری هەیە ؟

٩ـ مەرجەکانی واجب بوونی رۆژوو چین ؟

١٠ـ حوکمی درەنگ پارشێو کردن چی‌یە ؟

١١ـ کەی ئیسلام لەولاتی ( یەمەن ) دا بڵاو بوویەوە ؟

١٢ـ سوننەتە بەچی بەربانگ بکرێتەوە ؟

١٣ـ (یوم الشك) کام رۆژەیە ؟

# وەڵامـــەكـــــان

و١ـ واتە : زۆر زۆر گەرم .
و٢ـ (سيد الشهور شهر رمضان، وسيد الايام يوم الجمعة) رواه الطبراني.
و٣ـ دەروازەی (الريان) واتە : پاراو
و٤ـ چوار جۆر : واجب / سوننەت / حەرام / مكروە .
و٥ـ ( ١٠ ) ی رەمەزانی ساڵی (٨ك)
و٦ـ خالیدی كوڕی وەلید / ( ٢٥ ) ی ڕەمەزانی ساڵی (٨ك)
و٧ـ (إنا أنزلناه في ليلة القدر) (القدر -١)
(إنا أنزلناه في ليلة مباركة) (الدخان-٣)
و٨ـ ١/ ڕۆژووی رەمەزان ٢/ ڕۆژووی كەفارەت ٣/ ڕۆژووی نەذر .
و٩ـ سێ مەرج : موسڵمانێتی / عاقڵێتی / باڵغ بوون .
و١٠ـ سوننەتەو خێری زۆرە
و١١ـ لەمانگی رەمەزانی ساڵی ( ١٠ك)
و١٢ـ هەتا بكرێت بە (خورما) .
و١٣ـ ڕۆژی ( ٣٠ شەعبان) ە كە مانگ نەبینرێت .

١٤ـ چەند جۆر کەفارەتی ڕۆژوو شکاندن هەیە ؟

١٥ـ کێ وکەی (ئەندەلوس) ی ڕزگار کرد ؟

١٦ـ مەبەست لە وشەی (الروح) لە سورەتی (القدر) دا کێیە ؟

١٧ـ حوکمی پەلەکردن لە بەربانگ کردنەوەدا چیە ؟

١٨ـ روداوی (عین جالوت) بە فەرماندەیی کێ بوو ؟ کەی ڕوویدا ؟

١٩ـ کام دوعایە سوننەتە شەوانی قەدر زۆر بخوێنرێت ؟
٢٠ـ بەچ عوزرێک موسڵمان دەتوانێت بە ڕۆژوو نەبێت ؟
٢١ـ غەزای (بەدری گەورە) کەی ڕوویدا ؟
٢٢ـ مانگی رەمەزان چۆن دیاری دەکرێت ؟

٢٣ـ بە کام ئایەت ڕۆژوو فەرز کرا ؟

٢٤ـ کەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز کرا لە سەر موسڵمانان ؟

٢٥ـ گەورەترین ڕووداو کە لە رەمەزاندا ڕویداوە چیە ؟
٢٦ـ بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی چی خۆشترە ؟

و١٤ـ ١/ ئازاد كردنـى كۆيلـه ٢/ بـه‌ڕۆژوو بـوون ٣/ خـواردن دان ـ
ئه‌مانه به‌پێی جۆری ڕۆژوو شكاندنه‌كه ده‌گۆڕێت .

و١٥ـ تاریقی كوڕی زیاد / (٢٨) ی ڕه‌مه‌زانی ساڵی (٩٢ك)

و١٦ـ جبریل ـ سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت .

و١٧ـ سوننه‌ته .

و١٨ـ سوڵتان (قوطز) / ١٥ ی ڕه‌مه‌زانی ساڵی (٦٥٨ك)

و١٩ـ (اللهم انك عفو ، تحب العفو ، فاعف عني) رواه الترمزی .

و٢٠ـ سه‌فه‌ر / نه‌خۆشیی / پـیریی / سـكپڕیی / شـیردان / ترسـی
مردن له برسان یا تینوان / ناچار كردن به‌زۆر بۆ ڕۆژوو شكاندن .

و٢١ـ ڕۆژی هه‌ینی / ١٧ ی ره‌مه‌زانی ساڵی ( ٢ك )

و٢٢ـ به بینینی مانگ گه‌ر سایه قه بوو / كه نه بینرا بـه تـه‌واو كردنـی
٣٠ ڕۆژه‌ی شه‌عبان .

و٢٣ـ (یا أیها الذین آمنوا كتب علیكم الصیام كما كتب ... الآیـة)
(البقرة / ١٨٣)

و٢٤ـ ١٠ ی شه‌عبانی ساڵی (٢ك) ـ دوای گۆڕانی قیبله .

و٢٥ـ هاتنه خواره‌وه‌ی قورئانی پیرۆز بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ.

و٢٦ـ بۆنی ( میسك) .

٢٧ـ ئەو شتە گەورە گەورانە چین کە لەگەڵ هاتنی رەمەزان روو دەدەن ؟

٢٨ـ حیکمەی زۆر ئاو رادانە دەم ولوت بۆ رۆژووگر چیە ؟

٢٩ـ جەنگی (زوللاقە) لە نزیک ئەندەلوس ، کەی روویدا ؟

٣٠ـ کام فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ دەیسەلمێنێ رۆژوو مایەی تەندروستی یە ؟

٣١ـ رۆژوو گرتن لە رۆژی جەژنی قوربان و رەمەزان دا چۆنە ؟

٣٢ـ حوکمی سیواک کردن بۆ رۆژووگر چیە ؟

٣٣ـ حوکمی بۆنی خۆش لەخۆدان لەرەمەزاندا چی یە ؟

٣٤ـ شەوی (قەدر) ی پیرۆز ، کام شەوەی رەمەزانە ؟

٣٥ـ رەمەزان مانگی چەندەمی ساڵی کۆچی یە ؟

٣٦ـ بەچەند شاهێد بینینی مانگی رەمەزان دەسەلمێت ؟

٣٧ـ ئیمامی شافعی هەر رۆژێکی رەمەزان چەندە قورئانی خوێندووە ؟

٣٨ـ (قنوت) لە نوێژی تەراویحدا لەکەیەوە دەخوێندرێت ؟

٣٩ـ ئەو فەرموودە کامەیە دەیسەلمێنێ پارشێو بەرەکەتی تیایە ؟

و ٢٧ـ دەروازەکانی بە هەشت دەکرێنەوە / دەروازەکانی دۆزەخ دادەخرێن / شەیتانەکان سنک دەکرێن .
و ٢٨ـ کەراهەتی هەیە ، واتە باش نی یە .
٢٩ـ ( ٢٥ )ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٧٩ک)
و ٣٠ـ (صوموا تصحوا) رواه الطبراني وابن السني .
و ٣١ـ حەرامە ڕۆژویان تیا بگیرێت .
و ٣٢ـ تا بانگی نیوە ڕۆ سوننەتە ، لە دوای ئەوە کەراهەتی هەیە تا بەربانگ .
و ٣٣ـ کەراهەتی هەیە ، واتە باش نیە .
و ٣٤ـ بە ڕای زۆربەی زاناکان ، شەوی ( ٢٧ ) ە .
و ٣٥ـ مانگی نۆیەمەو لە نێوان ( شەعبان ) و ( شەووال) دایە .
و ٣٦ـ بەیەک شاهێدی پیاوی موسڵمانی عاقڵی باڵغی ڕاستگۆ .
و ٣٧ـ هەر ڕۆژێک خە تمێکی کردووە .
و ٣٨ـ لە ( ١٥ ) ی رەمەزانەوە تاکۆتایی مانگەکە .
و ٣٩ـ ( تسحروا ، فان في السحور بركة ) متفق عليه .

٤٠- ڕۆژوو گرتنی داود پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر- چۆن بووە ؟
٤١- کەی بتی (لات) شکێنرا ؟
٤٢- گەر بەربانگت لای کەسێک کردەوە ، سوننەتە چی بڵێیت ؟
٤٣- (فدیة) ی ڕۆژوو لە سەر کێ واجبە ؟
٤٤- ڕۆژووی (یوم الشك) حوکمی چۆنە ؟
٤٥- حوکمی ڕۆژووگرتن بۆ ئافرەتێک لە بێ نوێژیدا بێ چۆنە ؟
٤٦- چەند جار ناوی رەمەزان لە قورئاندا هاتووە ؟ کام ئایەتە ؟
٤٧- ڕۆژووەوان دوو شادی هەیە ؟ کامانەن ؟
٤٨- بۆ ڕزگار کردنی کەسێک لە خنکان لە ئاودا ، ئایا دروستە ڕۆژووەوان ڕۆژوەکەی بشکێنێت ؟
٤٩- دۆعای بەربانگ کردنەوە چۆنە ؟
٥٠- بە ئەنقەست سەرفیترە دان بخرێتە دووەم ڕۆژی جەژن چۆنە ؟
٥١- لەکەیەوە دروستە سەرفیترە دەربکرێت ؟
٥٢- جەنگی (تەبوک) کەی ڕوویدا ؟

ﻫ ٤٠- ڕۆژ نارۆژێک بە ڕۆژوو بووە .
و ٤١- ڕەمەزانی ساڵی ( ٩ ) ی کۆچی .
و ٤٢- (أفطر عندكم الصائمون ، وأكل طعامكم الأبرار ، وصلت عليكم الملائكة)
ۆ ٤٣- ئەو کەسانەی عوزری شەرعیان هەیە و ڕۆژوویان پێ ناگیرێت ، وەکو پیری کەنەفت .
و ٤٤- حەرامە ، مەگەر کە سەکە ڕۆژووی فەرزی لە سەر بێت ، یاخود حالەتێکی تایبەتی ڕۆژووی سوننەتی هەبێت ونەکرێ لێی لابدات.
و ٤٥- حەرامە بەڕۆژوو بێت .
و ٤٦- یەک جار . ئایەتی ١٨٥ ی سورەی (البقرة) ە .
و ٤٧- ( ١ ) خۆشی کاتی بەربانگ کردنەوە ( ٢ ) خۆشی کاتی پاداشت وەرگرتنەوەی لە قیامەتدا .
ۆ ٤٨- واجبە ڕۆژوو بشکێنێت بۆ ڕزگار کردنی ئەو کەسە لە مردن .
و ٤٩- (اللهم لك صمت ، وعلى رزقك افطرت ، وعليك توكلت ، وبك آمنت .. ذهب الظمأ ، وابتلت العروق ، وثبت الأجر ان شاء الله تعالى ..)
و ٥٠- حەرامە بە ئە نقە ست دوا بخرێت تا ڕۆژی دوەمی جەژن .
و ٥١- لای هەندێک لە زانایان هەر لەیەکەم ڕۆژی ڕەمەزانەوە دروستە بدرێت .
و ٥٢- هە ندێک لە ڕوداوەکانی لە ڕەمەزانی ساڵی ( ٩ک ) دابوو .

٥٣- بۆچی درەنگ پارشێو کردن سوننەتە ؟
٥٤- ڕۆژوو گرتنی (وصال) چۆنە ؟
٥٥- حوکمی (صوم الوصال) چۆنە ؟
٥٦- جیاوازی ڕۆژووی موسڵمانان و ڕۆژووی (أهل الكتاب) چی‌یە ؟
٥٧- پێغەمبەر ﷺ لە رەمەزانی هەر ساڵێکدا ، چەند ڕۆژ (ئیعتیکاف) ی دەکرد ؟
٥٨- حیکمەتی چیە ڕۆژووی دووشەممەو پێنج شەممە سوننەتە ؟
٥٩- کام جۆری ڕۆژوو ، دەکرێ تانیوە ڕۆش نیەتی بۆ بهێنرێت ؟
٦٠- چەند ساڵ جارێک ڕەمەزان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان شوێنی لەساڵدا ؟
٦١- کەی پەڕاوەکانی ئیبراهیم ،تەورات ، ئینجیل هاتونەتە خوارەوە ؟
٦٢- ئەندازەی سەرفیترە بۆ هەر کەسێک چەندە ؟
٦٣- ڕۆژوو گرتنەکەی حەزرەتی (مریم) چۆن بووە ؟
٦٤- بۆچی ڕۆژوی (رەمەزان + شەشەڵان ) وەکو ڕۆژووی ساڵێک وایە ؟
٦٥- بەپێی فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ سێ شت هەیە لە ئەخلاقی پێغەمبەرانی پێشوویش بووە ؟ چین ؟

و٥٣- (١) کاتەکە کاتی (سحر) ەو بەرەکەتی تیایە (٢) تا مرۆڤ زوو * برسی نەبێت .

و٥٤- ئەوەیە ڕۆژووی ئەمرۆ بدرێتە دەم ڕۆژووی سبەینێ و ، بەربانگ نەکرێتەوەو شەویش هیچ نەخورێت .

و٥٥- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی مەیکەن .

و٥٦- خواردنی پارشێو ، یەکێکە لە جیاوازیە گرنگەکان .

و٥٧- (١٠ ڕۆژ) ، بەڵام لە ساڵی وەفاتیدا (٢٠ ڕۆژ)

و٥٨- لەو دوو ڕۆژەدا کردەوەی مرۆڤ دەبرێتە بەربارەگای خوایی .

و٥٩- ڕۆژووی سوننەت .   و٦٠- (٣٦) ساڵ جارێک .

و٦١- پەراوەکان: (١)ی رەمەزان ، تەورات: (٦)ی ڕەمەزان ، ئینجیل: (١٣)ی رەمەزان .

و٦٢- یەک (صاع) لەوخواردنەی لە وڵاتەکەدا زۆر زۆر دەخورێت .

و٦٣- ڕۆژووی بێ دەنگی ، واتە هیچ قسەیەکی نەدەکرد .

و٦٤- پاداشتی چاکە بە (١٠ قاتە) بەلانی کەمەوە ، کەواتە (٣٦ڕۆژ × ١٠ قات= ٣٦٠ڕۆژ)

و٦٥- درەنگ پارشێو کردن ، زوو بەربانگ کردنەوە ، پێشخستنی لای ڕاست بە سەر لای چەپدا

تێبینی: لەمەسەلە فیقهی یەکاندا ، ڕای ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) خراوەتە ڕوو ، ڕەنگەڕای مەزهەبەکانی تر لەبارەی لەو پرسیارانەوە جۆرێکی تر بێت .

سەرچاوەکان

١-مفردات القرآن الكريم ٢-رياض الصالحين ٣-فقة السيرة للغزالي ٤- الفقة الاسلامي وأدلته ٥-كفاية الأخيار ٦-ڕۆژنامەی یەکگرتوو / ژ(١٢٠/ ١٢١) ٧- المنجد في اللغة .

## ئەم نامیلکە

کۆمەڵێک زانیاری پڕسوودی لە ئامێزگرتووە دەربارەی ڕۆژوو گرتن و مانگی رەمەزانی پیرۆز و ڕوداوە گرنگەکان کە لەم مانگە دا ڕوویان داوە .. هیوام وایە زانیاریەکان بۆ هەموو ئاست و چینێک سوودیان هەبێت.

لە خوا داوا کارم کە ڕۆژوو و پەستشەکانی هەموو لایەکمان لەم مانگە پیرۆزە گیرا بفەرموێت.